## تەوەری هەشتەم: بەشی کۆتایی ئەم پەرتووکە:

نە تەنیا مرۆڤ بەڵکو تەواوی گیانلەبەران بەهۆی ویست و ئیرادەوە دەژین و هیچ یەکی لەوانە لە (زانست و ویست و ئیرادە)و کارێ کە لەو ئیرادە و ویستەوە سەرچاوە دەگرێ، بێ بەهرە نین و هەر یەکێکیان خاوەنی خواست و بۆ گەیشتن پێی ڕێگەیەك دەگرنە بەر.

هەندێ جار لە هۆکارێکی تایبەت بەخۆی و هەندێ جاریش لە ئامراز و هۆکارگەلێ لە دەرەوەی بوونی خۆی و لە هەندێ بابەت و بواریشدا لە ئامراز و هۆکارگەلێکی دەروونی و دەرەکی پێکەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکەی کەڵك وەردەگرێ.

بەگشتی سروشتی تەواوی گیانلەبەرەکان بە تایبەتی مرۆڤ بە جۆرێکە کە: داوای شتێ دەکەن و دەتوانن پێی بگەن و لە ئەستۆی دەربێن و بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستی خۆیان پشت بە شتێ دەبەستن.

ویست و ئامانجیش دوو جۆرە:

**یەکەم:** ئەوانەی کە لە خودی خۆیاندا (لە زاتی خۆیاندا) ئامانج و مەبەستن.

**دووەم:** ئەوەی کە بەهۆی شتێکی ترەوە وەك ئامانج ومەبەستیان لێ دێت. ئامراز و هۆکارگەلێ کە بۆ هاوکاریی و ئاریکاریی لە پێناو گەیشتن بەو ئامانج و مەبەستە بەکاری دێ و بە واتایەکی تر یارمەتی و دەست گرۆییان لێ داوا دەکرێت، ئەوانیش دوو جۆرن:

**یەکەم:** ئەوانەی کە لە خودی خۆیاندا یارمەتی دەروهاوکارن.

**دووەم:** ئەوانەی کە بە شوێنکەوتەوە و ئامرازی ئەو دێنە ئەژمار.

کە واتە سەبارەت بەمە چوار بابەت تەرح دەکرێن:

١. شتێ کە لە زاتی خۆیدا ئامانج و مەبەستە.

٢. کاروبارێ کە لە پەیوەندی لە گەڵ کاروبارهایەکی تر دەکەونە بەر سەرنجدانەوە.

٣. شتانێك كه له زاتی خۆیاندا یارمەتی دەرو هاوكاریكەرن.

٤. له پەیوەندی به ئامراز و هۆكار بوونەوه و به شێوه و جۆرێكی تر دەكەونه بەر سەرنجدانەوه.

مەبەست ئەوەیه كەوا گەر دڵی ئامانجێكی هەبێ و پێی ئاسووده ببێت و بەدرووستی خۆشی بووێت و پێویستی به شتێكه كه بۆ گەیشتن پێی كەڵكی لێ وەربگرێ و داوای یارمەتی لێ بكات.

یارمەتی دانیش داواكراوه و بەكارهێنراوه. پەرستش و داوای یارمەتی كردن له زۆرێك له بوارەكاندا (مەسەلەكاندا) پێویست و پێویستكراوی (لازم و ملزوم) یەكترین.

هەر شتێ كه دڵ له پەیوەندی له گەڵ ژیان و گوزەران و یارمەتی دان وكەڵك و قازانجی خۆی وابەستەی بێت و دڵی پێ بدات، له بەرامبەری دا گوێڕایەڵ و تەسلیم دەبێت، ئەگەر چی له بەر زاتیشی خۆشی نەوێت، له ڕووەوه خۆشی دەوێت، بەڵام هەندێ جار باروودۆخ بەسەریدا زاڵ دەبێ و دەستی بەسەردا دەگرێت و لەبەری زات و جەوهەر و كەسایەتی (ماهییەتی) خۆشی دەوێت و ئەو ئامانج و مەبەستەی كه لێی هەبووه فەرامۆشی دەكات.

هەندێ جار دڵ شتێكی خۆش دەوێت و به ئامانج و مەبەستی خۆی له قەڵەمی دەدات و دەیژمێرێ، بەڵام داوای یارمەتی و هاوكاری لێ ناكات و بۆ گەیشتن پێی پشت به شتێكی ترەوه دەبەستێ. وەك كەسێ كەوا كەماڵ، پلەو پایه یاخود ژنێكی خۆش بووێت و گیرۆده و عەودالی ببێت، ئەگەر بزانێ دڵدارەكەی (معشوق) توانای فەراهەم كردنی ئامانج و مەبەستی ئەوی هەیه، پشتی پێ دەبەستێ و لەم كاتەدا و بەم شێوەیه (خۆش ویستن و یارمەتی دانی) ئەو لەسەر یەك ئامانج و مەبەست كۆ دەبێتەوه. له ئەنجامدا مەسەلەكه چوار تەوەر پەیدا دەكات:

یەكەم: خۆشەویست و دڵدارێ كه لەبەر زات و نەفسی خۆی، هەم خۆشەویست و هەمیش یارمەتی دەر دەبێت، ئەمه بەرزترین و گەورەترین جۆره و هیچ كەس و هیچ

شتێ جگە لە پەروەردگار (جلّ جلالّه) بەم جۆرە نییە و جگە لەو دەبێ لە پەیوەندی لە گەڵ خۆشویستنی ئەودا ببنە خۆشەویست و وەك ئامراز و هۆکار یارمەتی و هاوکارییان لێ وەربگیردرێ.

دووەم: شتێ کە بەهۆی زاتی شتێکی ترەوە خۆشەویستە و داوای یارمەتیشیان لێ دەکرێ، وەك دڵدارێ کە توانای ئەوەی هەبێ کەوا ئامانجی خۆشەویستەکەی (عاشق) بەجێ بهێنێ.

سێیەم: خۆشەویست و کە بۆ گەیشتن پێی، لە کەس و شتێك داوای یارمەتی بکرێت.

چوارەم: هاوکار و یارمەتی دەرێ کە داوای یارمەتی لێ کراوە، لەبەر خاتری خۆی نییە کە ببێتە خۆشەویست.

کاتێ کە ئەم کاروبارانە بناسرێن، ئاشکرا دەبێت کە، کامە لەم چوار جۆرە شایانو شایستەی (بەندایەتی و داوای یارمەتی کردنیان) هەیە و خۆش ویستن و داوای یارمەتی کردن لە غەیری ئەو ئەگەر هۆکارێ نەبێ بۆ خۆش ویستن و یارمەتی دانی ئەو دەبێتە مایەی زەرەر و زیان و شەڕ و خراپەی مرۆڤ و زەرەر و زیانی لە کەڵك و قازانجی زیاترە.

پێویستە لە کۆتایدا بڵێم: "هەرچی کەموکوڕی و ناتەواوی وخەوش و نیازمەندی هەیە، لە پەروەردگاری گەورە و زانا و کاربەجێ و بێ نیاز و بە دەسەڵاتەوە دوورە و تەواوی و کامڵی و بێ خەوش و غەشی و بێ کەموکوڕی تەنیا بۆ ئەوە و بەس".

وەرگێڕ

٢٠١٠/٧/٢٤زایینی (خورماڵ)

١٢/شعبان/١٤٣١کۆچی

# ناوەڕۆك